زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

٢٤




# گەشتێکم لە گومانەوە بۆ باوەڕ



محمد مەلا صالح شارەزووری

کردوویە بە کوردی

بڵاوکراوەی نووسینگەی تەفسیر

تەفسیر

هەولێر - چاپی یەکەم ٢٠٠٢

## مەبەست لە زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی:-

١. دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردیە بە گرنگترین وکاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی، کە مەشخەڵی سەررێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین.

٢. ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسوڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی، کە سەرچاوەن بۆ رۆشنبیری ئیسلامیی‌و سازێنەری بێداری‌و قیامەتی ئیسلامیی پیرۆزن.

٣. شارەزاکردنی راستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیانە لە گشت کۆت و بەند و بۆچونی تەسکی حزبایەتی و تاکرەوی‌و رەوتگەرایی.

٤. بناغەیەك بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتیەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەر تاکێکی موسوڵمانی کورد، تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکاریانەی هەبێ، کە خوای پەروەردگار پێی سپاردوە.

دەگەڵ رێز و تەقدیرمان بۆ بیروڕای نووسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرجیش نیە ئێمە پابەندی هەمو بیروبۆچونەکانیان بین.

با دەستوریشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت، کە دەفەرموێ:

﴿ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ : ئەو کەسانەی گوێ لە قسان ڕادەدێرن و بەشوێن چاکترینیاندا دەچن، ئەوان خودا رێی بەرەو خۆی نیشان داون، ئەوانە خاوەن ئاوەز(عەقڵ)ن.﴾ الزمر/١٨

نوسینگەی تەفسیر

# گەشتەکەم
# لە گومانەوە بۆ باوەڕ


نووسینی

دکتۆر مصطفى محمود

وەرگێڕانی

محمد مەلا صالح شارەزووری



تەفسیر

هەولێر

ناوی پەرتوك بە عەرەبی: رحلتي من الشك الى الإيمان
نـــاوی نوســــــەر: مصطفى محمود
نـوۆرەی و ســاڵی چـاپ: چاپی دوازدەهەم
ناوی پەرتوك بە کـوردی: گەشتەکەم لە گومانەوە بۆ باوەڕ
نـــاوی وەرگــــێر: محمد مەلا صالح شارەزووری
ســـاڵی وەرگـــێڕان: ١٩٧٣
چـاپ و بڵاوکردنــەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر
خــــــــــەت: نەوزاد کۆیی
نـوۆرە و ســاڵی چـاپ: دووەم ١٤٢٤
چاپخانـــــــــە: چاپخانەی پەروەردەی هەولێر
ژمـــارەی ســپاردن: (٢١٣)ی ساڵی ٢٠٠٢
تــــــیراژ: ١٥٠٠ دانە

تفسیر
هەولێر - شەقامی دادگا
ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨
tafseeroffice@maktoob.com
AlTafseer@hotmail.com

# پەیڤێك

کاتێ (د.مصطفی محمود) ئەم کتێبەی دانا، لەلایەن بڕوادارانەوە پێشوازیەکی گەرمی لێکرا، هەرچەندە هەندێ چڵکی کۆنە مەنزڵی ڕێگا چەوتەکەشی هەر پێوە مابوو.

ئەو کاتە بێبڕوایی باوبوو، رابونی ئیسلامی لە سەرانسەری جیهان وەك ئێستا گەش و بەرچاو و پەرەی نەسەندبوو، هەر بۆیە بڕواداران بۆ ئەم جۆرە دیاردانە ئامێزیان دەکردەوە و بایەخی زۆریشیان پێدەدا، بە دەگمەن دیاردەی ئاوا بەرچاو دەکەوت، کە وەك ئێستا نەبوو.

گەشتەکەی پیاوێکی زانا و قەڵەم ناسك و ناسراوی وەك (د.مصطفی محمود) لە نزمی بێباوەڕی و پابەندنەبون بە شیرازە ئەخلاقیەکان و ئایین و کۆمەڵ بۆ لوتکەی ئیمان و رەوشت پاکی، کارێکی گەورە و کاریگەر بوو، کە دەروازەی هیدایەت و رێنمایی بۆ زۆر کەسی تر کردەوە.

هەر بۆیە مامۆستا (محمد شارەزوری)-خوا لێی خۆش بێ- زوو بەپیر ئەم ئەرکەوە چوو، سەربوردەی (د.مصطفی محمود)ی بە کوردی خستە بەر دەست خوێنەری کورد.. بەرنامەی وەرگێڕانەکەشی بریتی بوو لە جەخت کردن لەسەر خاڵە گرنگەکانی ئەم کتێبە، نەك وەرگێڕانی دەقاودەق و وەکو خۆی.. هەروا ساڵانی حەفتاکان، کە مامۆستا ئەم کتێبەی تێدا وەرگێڕاوە، نوسین و وەرگێڕان بەکوردی و بۆ کوردی پەرەی نەسەندبوو

جا بە مەبەستی تۆکمە و وەرگێڕانی دەقاودەق و وەکو خۆی، ئێمە لە نووسینگەی تەفسیر هەستاین بە وەرگێڕانی ئەو دەقانەی، کە مامۆستا شارەزوری بە پێویستی نەزانیوە پاچڤە(ترجمة)ی بکات.

دیاره مامۆستای کۆچ کردوو ژمارەیەکی کەمی ئەم کتێبەی بەچاپ گەیاند، کە چاپەکەشی نارێك و جوان نەبوو، بۆیە لەبەر گرنگیی و کاریگەریی ئەم کتێبە و رێز و خۆشەویستیمان بۆ مامۆستا شارەزووری وەرگێڕ، نوسینگەی تەفسیر بەچاکی زانی کتێبی (گەشتەکەم لە گومانەوە بۆ باوەڕ) چاپ و بلاو بکاتەوە، تا رۆشنفکران و خوێندەوارانی راستەقینەی کورد لێی سودمەند بن و ئاسۆی بیریان فراوان بێت، هەروا ئاشنای ئەم کەڵە نوسەرە بن.

نوسینگەی تەفسیر
هەولێر
٢٠٠٣/٢/٢٤

# پێشەکی

پێشینان وتویانە (بەسەد حکیم بە قەد دەردە دارێك نازانن) ئە مە زۆر جوان و ڕاستە:

ئادەمیزاد خۆی ڕێگای گومان و دوو دڵی تاقی دەکاتەوە و، بیروباوەڕی شەن و کەو نەکات و، پوختە تەتەڵەی نەکات، هەر نانێکی کردەوەی لا بکات، بێ پێز دەر ئەچێت و بە کەڵکی خواردن نایەت.

هەزاران مەلا باسی مادد‌یەت بکەن و بەراوردی بکەن، لەگەڵ بیروڕای ئیسلامدا و هەزاران بەڵگەی جۆر بە جۆر بهێننەوە -با فەرموودەکانیشیان ڕاست بێت- تامی ئەوە نادات، یەکێك لەو شارەوە هاتبێتەوە و پرسیارێکی لا بکرێت.

هەر بەو نیازەوە زۆر گەڕام بە دوای یەکێکدا، کە سەرێکی لەم شارە دابێت گەرچی شەویشی تێدا بەسەر نەبردبێت، تاکوو هەندێ باسی ژیانی ڕاستەقینەی ئەو شارەم بۆ بکات، {بەڵام ئەوەی کە لە وڵاتی ئێمەدا ڕێی گرتبێتە بەر بۆ (شاری باوەڕ بە مادە و بەس) یان هەر لە دوورەوە کە چز و هۆڕی هەڵچرقاندنی هۆش و باوەڕی بەر لوت کەوتوە، ئیتر گەڕاوەتەوە و نەچۆتە ناو شار، یان هەر لە نوختەی پشکنینی شار، چەکی هۆشیان لا داڕنی و دەرزی‌یەکی بەنجیان لێدا و کردیانە ناو شارەکەوە}.

بەڵام کاتێ بۆ یەکەم جار کتێبی (رحلتي من الشك الى الإيمان)م خوێندەوە

بۆم دەرکەوت، کە (مصطفی محمود) زۆر بلیمەتانە توانیویێتی لە لارێ و پشت نوختەی دارِنینی هۆش خۆی بدزێتەوە و، بچێتە ناو ئەم شارەوە. نەك چەند رۆژێك بەڵکو تەمەنێکی زۆرێ تێدا بەسەر بردووە و بەهۆی هۆشەوە، کە فیشەکی زانیاری دەخوات، بەربەرەکانێی لەگەڵ هەموو چەتەکان و قۆڵ برەکانی ناو شار بکات و بەسەریشیاندا زاڵ بێت .

... بەڵێ، بەسەرهاتەکەی بە تەواوی سەرنجی راکێشام، بۆیە دەستم دایە خامە، کە بیگۆرِمە سەر زمانە خۆشەویستەکەی خۆم، زمانی (کوردی) پاش ئەوەی لە گۆرِینەکەی بومەوە، بەهۆی (دار الشرق)ەوە لە قاهیرە، نامەیەکم بۆ دکتۆر مصطفی نارد.. ئەویش وەڵامی نامەکەمی بەم جۆرە نوسی‌یەوە وا نامەکەی لێرەدا بە کوردی دادەنێم بۆ ئەوەی زیاتر دانەر بناسین.

**نامەکە:-**

برای خۆشەویستم (محمد ملا صالح) پاش سڵاو، نامەکەت کە بەهۆی دار الشروق لە قاهیرە ناردبووت، بەدەستم گەیشت ویستبووت، کە هەندێ لە مێژووی ژیانم بزانیت، تاکو لە سەرەتای وەرگێڕاوەکەتدا بینوسیت... سوپاست ئەکەم. بۆ ئاگاداریت هیوام وایە ئەم نوسراوە کورتەی خوارەوە بۆ سەرەتای نوسراوەکەت بشێت:

نوسەر ناوی (مصطفی کمال محمود حسین)ە لە رۆژی ١٩٢١/١٢/٢٥ لە (شبین الطوم) کە شارێکی بچووکە لەسەر رووی دەریا لە میسر لە دایك بووە، پاش چەند مانگێك ماڵیان چووە بۆ (طنطا) لەوێ خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی تەواو کردووە. لە دواییدا چووە بۆ (قاهیرە)، لە (دیسەمبەر)ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٢ زانکۆی تەواو کرد و بوو بە پزیشك.

ماوەی حەوت ساڵ پزیشك بوو لە بەشی نەخۆشی‌یەکانی سـنگدا. لە ساڵی (١٩٦٠) وازی لە پزیشکی هێنا و دەستی کرد بەنووسین.

لە مێژەوە دەستی کردووە بە نووسینی وێژەوانی وەکو هەڵبەست و کورتە چیرۆك، بەڵام هیچیانی بڵاو نەکردۆتەوە، تا ساڵی ١٩٤٧ کە لە گۆڤاری (الرسالة)دا. یەکەم چیرۆکی لە ژێر ناونیشانی (الهواجس)دا بڵاو کردەوە. ئیتر دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی لە رۆژنامە و گۆڤاری (المصري، أخبار اليوم، أخر الساعة، کتب للجميع، التحرير، روز اليوسف، صباح الخير)دا.

ئێستاش لەسەر نووسین بەردەوامە.

لەو ماوەیەدا (٣٥) بەرهەمی جۆر بە جۆری لە کورتە چیرۆك و شانۆگەری و لێکۆڵینەوەی دەرچووە.

بەرهەمە ئیسلامیەکانی:

یەکەم کتێبی (الله والانسان) بوو، کە بەتەواوی هێرشی تێدا کردۆتە سەر ئایین و گاڵتەی بەمە کردووە، کە ئایین هێناویەتی وەکو نادیار (غیب) و (موعجیزە و خواریق)، زیاتر بۆنی بیروباوەڕی (......) و ماددی‌یەتی لێوە دەهات، کاتێ ئەم کتێبە دەرچوو، بە فەرمانی دادگا بڵاوکردنەوەی قەدەغە کرا.

بەڵام لەم ساڵانەی دوایی‌یەدا گۆڕانێکی بیروباوەڕی بەسەرداهات و بۆی دەرکەوت، کە زانیاری ناتوانێت هەموو شتێك شیتەڵ بکات. چونکە بەشی زانیاری دیاری کراوە لە چەندایەتی و ئەو پەیوەندی‌یە ئاشکرایەی، کە لە نێوان ماددەکاندا هەیە و، دانانی یاسا بۆ جم و جۆڵیانە. ئیتر ناتوانێت ئەو پەڕی ڕاستی هیچ شتێك بزانێت.

دیسان زانیاری خۆی لە غەیبدا چەقیوە، چونکە ئەو باسی کارەبا و موگناتیس و کێشەر (جاذبية) دەکات، بێ‌ئەوەی بێجگە لەو شوێنەوارە هیچیانی لا ببینێت، باسی ئەلیکترۆن دەکات بێ ئەوەی چاوی پێی بکەوێت.

بەڵکو بەر هەستی دەکەوێت و بەس، ئیتر زانیاری مافی ئەوەی نیە، تانە لە نادیار(غیب) بدات. لە کتێبەکانی (المستحيل، لغز الموت، لغز الحياة،

العنكبوت، الخروج من التابوت) و، (رحلتي من الشك الى الايمان) دا باوەڕی ئەچەرخێنێ لە زانیاریەکی ماددی‌یەوە بۆ فەلسەفە ..بۆ ئایین.. لە پاشدا لە کتێبەکەی دا بە ناوی (القرآن محاولة لفهم عصري) باوەڕی ئاشکرا دەکات، کە (هەر ئیسلامە دەتوانێت هەموو گیروگرفتێك چارەسەر بکات، زیاتر لە زانستی هەموو زانایەك و فەلسەفەی هەموو فەیلەسوفێك)

لە ساڵی (١٩٦٢ ز)دا ژنی هێناوە و دوو کوڕی هەیە.

* * *

جا داواکارم هەر کە نووسراوەکەت چاپ کرد چەند دانەیەکم بۆ بنێریت بەم ناونیشانەی خوارەوە:

الدكتور مصطفى محمود

١٠٢ شارع النيل شقه ٧٢ القاهره

ئیتر سڵاو و خۆشەویستیم پێشکەشتە.

* * *

ئێمەش با دەست بکەین بە خوێندنەوەی گەشتەکە.

**محمد مەلا صالح شارەزوری**
**کورگەدەری شاربازێڕ**
**١٩٧٤/٤/٤ز**

ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر، بە تەواوی نایەتەوە بیرم.. تازە لە پلەکانی سیانزە و چواردەساڵی تەمەنم سەر دەکەوتم و بەرە و بالق بوون دەچووم، وردەوردە بەرەو ڕێگای یاخی بوون دەچووم و بێپەروا ئەم پرسیارانەم بەدەمدا ئەهات:

- ئێوە دەڵێن خوا دنیای دروست کردوە.. چونکە پێویستە هەموو بەدیهێنراوێك بەدیهێنەری هەبێ و.. هەموو هەبوویەك داهێنەری هەبێت.

بەڵێ ڕاستە و.. باوەڕمان هەیە، بەڵام پێم بڵێن ئەی کێ خوای دروست کردووە..؟ یان هەر لە خۆیەوە هاتووە و بووە.. ئەگەر وا دەڵێن و بە لاتانەوە ڕاستە، ئەی بۆ ڕاست نەبێ کە دنیا هەر لە خۆیەوە بوو بێت بەبێ وەدیهێنەر و بە کورتی ببڕێتەوە و کۆتایی بەم کێشەیە بهێنین.

کە ئەمانەم دەوت دەم و چاوەکانی دەورروبەرم زەرد هەڵئەگەڕان و.. زمانەکان بارانی جنێویان بەسەردا دەباراندم و بۆ لێدانم لە ڕاست و چەپەوە مشتەکۆڵەکان پێشبڕکێیان بوو.. تەنیا پیاوە باشە دڵ نەرمەکان بۆم دەپاڕانەوە، کە لەم یاخی بوونە رزگارم ببێت و خوا ڕێگەی ڕاستم نیشان بدات. پیاوە بەڕێز و سەنگینەکان لێم دوور دەکەوتنەوە.. یاخیبووەکان لێم کۆ دەبوونەوە، ئەو کاتەش پێکەوە لە دەمەقاڵێیەك نقوم دەبووین کە کۆتایی نابێ، مەگەر دەست پێبکرێتەوە، دەستیش پێ ناکرێ هەتا بە شێنەیی و لەسەرخۆیی دەمەقاڵێیەکە نەکرێ.

لەو رۆژانەوە، بە هۆی ئەم شەڕە وتانەوە، ڕاستیم لا ون بوو، وردە وردە هۆشم پەیداکرد و... فێری قسە کردن بووم، حەزم لە ڕازانەوەی وتە و وشە دەکرد. ئەمەش بوو بەهۆی پالْ پێوەنانم بۆ یاخی بوون و هانی دەدام.

وتەکانم بۆ دۆزینەوەی ڕاستی نەبوو، بۆ راستی نەبوو... بەڵێ بەم جۆرە لە خوا یاخی بووم و پشتم لە فەرمانەکانی کرد و دەستم کرد بە پەرستنی خۆم، چونکە زۆر دڵخۆشبوم بەو تروسکایی رۆشنبیرییەم، بە شوێن چەرە دوکەڵی ئارەزوومدا دەڕۆشتم. ئەم هەستە هەموو رۆژێك تازە دەبوویەوە... هەتا چۆنێتی وتووێژم لە بیر چوویەوە، بوومە دوژمنی خۆیشم... دەمویست بەزۆر بەخۆم بڵێم خوا هەیە.. کەچی.. دڵم.. دڵی کرمۆڵم پێی دەوتم ئاخر کێ خوای دروست کردووە..؟

بەڵام هەر پێویستە، یەکەم کەسێ هەبێ، کە دروستکەر بێ و هەر خۆی لە خۆیدا بووبێت و، بۆ دروست کردنی خۆی و دروست کراوەکانی پێویستی بەکەس نەبووبێ..

ئەگەر ئەمیش یەکێ دروستی کردبێ، یەکێکی تر ئەمی دروست کردبێ.. تا دەڕوات.... ئەمە دەبێت بە زنجیرە دروستکراوێك، هەتا بڕوات یەکەم دروستکەر نادۆزرێتەوە، ئەمەش نابێت و ناگونجێت و... ئەمەش ڕەهەندی ئەو کێشە فەلسەفیەیە کە (ئەرەستۆ)[1] بڵێت (هۆی یەکەم و خولدەری یەکەمی ئەم گەردوونە، دەبێ هەبێت). بەڵام ئەو کات ئەم ڕەهەندانە لە بیر و زیهنم دا ڕوون نەبوو، هەروا (ئەرەستۆ) و وتەکانیم بە تەواوی نەدەناسی و نەم دەزانی یاسا بەرایییەکانی ژیربێژی و دەمەقاڵێ(جدل) چییە.

---

[1] ئەرەستۆ-مامۆستای ئەسکەندەر و فەیلەسوفی یۆنانییە، زۆر دانراوی هەیە لە ژیربێژی(منطق) و سروشت گەری(طبيعيات)دا.

لەم دۆخەدا مامەوە تا ماوەی (٣٠) ساڵێك، كە ون بوو بووم لە ژێر خوێندنەوەی پەرتووك و هەزاران شەوی تەنیایی و گۆشەنشینی بۆ خوێندنەوە و بیركردنەوە و وتوێژ لەگەڵ خۆمدا دوپات كردنەوەی بەستن و هەڵوەشانەوەی هەزاران جۆرە بیروڕا.. دیسان بیری خۆمم گۆڕی بۆ بڕینی ئەو ڕێگە پڕ لە دڕكە لە نێوان (خواو مرۆڤدا)[1] بۆ هەڵهێنانی (مەتەڵی ژیان و مەتەڵی مردن)[2] و بەسەرهاتمان پاش مردن، تاكو بتوانم ئەمە بە دڵێكی پڕ لە باوەڕەوە بنووسم.

بەڵام نەك بە ئاسانی، چونكە فێر نەبوو بووم بە ئاسانی ڕاستی وەربگرم.

جا ئەگەر من گوێم بگرتایە لە دەنگی (سروشت=فطرة)م و بیرم بكردبایەوە، ئەوا خۆم لە كوێرەوەری دەمەقاڵێ ڕزگار دەكرد و دەیگەیاندمە لای خوا.

بەڵام من لە كاتێك دا دەژیم، كە هەموو شتێكی تێدا ئاڵۆزە و دەنگی فیترەتی تێدا كزە، هەتا وای لێ هاتووە بوە بە چرپە، دەنگی ژیریش زاڵ بووە و بۆتە ژاوەژاو.

عەقڵ لە زێدەڕۆیی كردنی لێی ناگیرێ، چونكە ئەویش یاخی بوو بوو.. پێی زیادی ڕاكێشابوو.. خۆی وا دەبینی ئەو... پیشەسازی-كارەبا-ڕۆكێت- فڕۆكەی بە شارستانێتی بەخشیوە، خۆی دەیبینی لوتی داوە لە ئاسمان و بنی دەریا.. ئیتر وای دەزانی دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێكدا هەیە. خۆی فڕێ دەدایە هەموو شتێكەوە، خۆیشی دەكرد بەدادوەر بەسەر هەرشتێ، بیزانێ یان نەیزانێ .

كاتی منداڵیم، لە كتێبخانەی شارەوانی لە (طنطا)[3]، خۆم كردبوو بە ژێر

---

[1] خـوا و مرۆڤ: (الله و الانسان) یەكەم دانراوی (مصطفى محمود)ە لەم كتێبەدا بەتەواوی دەری خستوە كە بیروباوەڕی بەبونی خوا نیـیە.

[2] مەتەڵی ژیان، مەتەڵی مردن (لغز الحیاه ، لغز الموت) دوو دانراوی (مصطفى محمود)ن.

[3] طنطا، شارێكی گەورەی میسرە و جەمسەری هەموو هێڵی ئاسنینە.

کتێبەوە، وتەکانی (شمیل) و (سلامە موسا)[1]م دەخوێندەوە، تا (فرۆید)[2] و (داروین)[3] بناسم.

بە کیمیا و سروشتیگەری(الطبیعة) و بایۆلۆجیاوە خۆم خەریك دەکرد. لە ماڵەوەشدا کارگەیەکی بچووکم هەبوو، کە تێیدا خەریکی دەرهێنانی کاربۆن و دووەم ئۆکسیدی گۆگرد بووم و (سیسرکە)م بە کلۆر دەکوشت و لاشەی بۆق-م توێکار(تشریح) دەکرد.

چونکە هاوارێك هەبوو هەموو جیهانی گرتبووەوە، کە ئەویش زانست بوو... زانست... زانست، هەر زانست.

دیدی بابەتیانە(النظرة الموضوعیة) تاکە ڕێگەیە.

ئیتر با واز لە نادیاریەکان(الغیبیات) بهێنین و بەس بخورد بسوتێنین و شتی پڕوپوچ کاوێژ بکەینەوە و دوای ئەفسانە بکەوین.

دەم وت کێ فڕۆکە و تانك(دبابە)مان دەداتێ و ئایین و پەرستنەکانمان لێ وەردەگرێ؟ هەواڵەکانی زانستی ڕۆژ ئاوایی، کە بە ئێمە دەگەیشت، سەرسوڕهێنەر بوو، ئاوی چاومان پێی دادەهات، ئێمە هەموو شتێکمان لە ڕۆژئاوا وەردەگرت... پەرتووك، داودەرمان، شەمەندەفەر، ئۆتۆمۆبیل، خواردنی ناو قوتوو، پێنووس، دەرزی، شێوازی داڕشتنی ئەدەبیو وێژەوانی، لە چیرۆك و شانۆگەری و پەخشان، تەنانەت کاغەزی دەرکردنی ڕۆژنامەش. لە باسی پاڵەوانەکانی ڕۆژئاوا و پیتۆلەکانی، خەوی خۆمان دەزڕان و سەرمەشق لە

---

[1] سەلامە موسا: یەکێکە لە ئەدیبەکانی قبطی لە میسر، لە لەندەن و پاریس خوێندوویەتی خاوەنی کتێبی (الانسان قیمة التطور)ە.

[2] فرۆید: فەیلەسوفێکی نەمساوییەو داهێنەری ڕێگەی شیتەڵ کردنەوەی ئەفسانەییە.

[3] داروین: زانایەکی ئینگلیزییە خاوەنی بیردۆزەی (النشوء والأرتقاء)ە.

(باستیر)[1] (مارکۆنی)[2] و (رۆنتگن)[3]و (ئەدیسۆن)[4] یان (ناپلیۆن)[5] و (ئەبراهام لنکۆڵن) و (کریستۆف کۆلۆمپس)[6] و (ماجەلان)[7]مان دەکردنە نمونەی بەرزمان.

بە کورتی هەر ئەوان پێشکەوتو بوو بوون.

بەڵام ئێمە دواکەوتوین بێ هێزین و لە ژێر پێی داگیرکەرانا داتەپیوین.

بەڵێ، وامان دەزانی هەرشتێك لەلای ئەوانەوە بێت رۆناکی و ڕاستی‌یە و... تاکە ڕێگاچارەی هێز و ڕزگار بوونە..

لە پاشدا چوومە کۆلیجی پزیشکی(کلیه الطب) تاکو زانستەکان بە زمانی ئینگلیزی بخوێنم و لە سەرچاوە ئینگلیزیەکان توێکاری(تشریح) بخوێنم، هەروا لە نەخۆشخانە بە زمانی ئینگلیزی قسە لەگەڵ مامۆستاکانم بکەم.. ئەمە بەس لەبەر ئەوە نەبوو کە نۆکەندی (سوێس) ئینگلیز داگیری کردبوو، بەڵکو لەبەر هۆیەکی مەشروع و ڕاستر بوو، کە ئەویش ئەوەبوو، زانیاری پزیشکی نوێ بە تەواوی پیشە و دەستکردی رۆژئاوایی بوو... ئەو هەوڵەی لەکاتی (ابن سینا) و هاوەڵەکانیدا دراوە سەرەتا بوەو دەوای دەردی ئێستا ناکات.

بەڵێ، ڕۆژئاوایی‌یەکان دەستیان بە گوریسەکەوە گرت، کە بە (ابن سینا)[8] و

---

[1] باستێر: زانایەکی فەرەنسی بوو دەرمانی نەخۆشی سەگی دۆزیەوە.
[2] مارکۆنی: زانایەکی ئیتاڵی‌یە و داهێنەری (بێ‌تەل)-لاسلکی-و ڕادیۆیە.
[3] رۆنتگن: زانایەکی ئەڵمان بوو داهێنەری بروسکە-اشعە-یە.
[4] ئەدیسۆن: زانایەکی ئەمریکی‌یە و داهێنەری کارەبا و کامێرا و قەوان بوو.
[5] ناپلیۆن: سێ پاشای فەرەنسە بوون هێرشیان هێنایە سەر میسر (١٧٩٨) ز.
[6] کریستۆف کۆلۆمپس: دەریاوانی ئیتاڵی بوو ئەمەریکای دۆزیەوە.
[7] ماجەلان: دەریاوانی پورتوگالی بوو هەوڵی گەشتێکی سەر زەوی دا بەڵام لە فلپین کوژرا.
[8] ئیبن سینا: زانای پایەبەرزی ئیسلامە لەساڵی ٩٨٠ لە بخاری لەدایك بووەو لەساڵی

توێژەرە موسڵمانەکان کۆتاییان هات، ئینجا ئەوان بە توانیستی پیشکەوتووەوە دەستیان پێکردەوە، ئەویش بە هێنانی کارگەی گەورەو تاقیکردنەوەو تەرخانکردنی هەزاران ملیۆن دینار بۆ لیکۆڵینەوە، تاکو توانیان پێش پێشوەکان بکەونەوە، چ لە موسڵمان و چ لە نەتەوەکانی‌تر، کۆشك و تەلاری زانستی پزیشکی نوێ و فسیۆلۆژیا و توێکاری و باثولۆجیایان بەرپا کرد، تاکو بەڕاستی بوون بە سەرچاوە.

لە کتێبە پزیشکەیەکاندا فێری ئەوە بووم، کە گشت شتێ بە گەز و ترازوی زانیاری بپێوم و بکێشم. ئەوەی بینراو هاتە ژێر میکرۆسکۆبەوە هەیە و ڕاستە، ئەوەیش وانەبوو، نیە.

زانست خۆی لە بینراو و هەست پێ‌کراو و دەست لێدراوەوە(المنظور والمحسوس والملموس) دەست پێ دەکات.

خودی زانست بریتی‌یە لە کردەی کۆکردنەوەی چەند بینراوێك و دەرهێنانی چەند یاسایەك.

ئەوەی هەستی پێ‌نەکرێت لە دیدی زانستیەوە مانای نەبوونە.

نادیار(غیب) لە یاسای زانستیدا حسابی نیە.

ئا بەم جۆرە گەڕانەکەم دەست پێ‌کرد، بەهۆشێکی زانیاری ماددی لە جیهانی بیروبڕواوە. سەرەڕای ئەو زەمینە مادیە و ئەو شتە هەست پێکراوانەی کە نکوڵی نادیار دەکەن، نەمتوانی هێزی خوایی بەلاوەنێم و نەرێی لێ بکەم.

بەڵام وەنەبێ زانیاری وازی لێ‌هێنابم و هێشتبێتی لەسەر یەك بار بمێنمەوە، چونکە هەموو ڕۆژێك جوانترین وێنەی ئەم بوونەوەرەی نیشان دەدام...

---

١٠٣٧ز لە هەمەدان کۆچی دوایی کردووە.

هەموو شتێك هەر لە (گەڵای دار، باڵی پەپولە، زیخ و چەو) ڕێکوپێکی و جوانی یاسای تێدایە.

بوونەوەر هەمووی بە ئەندازە و چەند یاسایەکی زۆر ورد دانراوە.

هەموو شتێك بە یاسا دەجولێتەوە هەر لە وردترین شت لەم بوونەوەرەدا هەتا ئاسمانی گەورەو خۆر و ئەستێرەکانیتر، کە ژمارەیان لە هەزار ملیۆن خۆر زیاترن، ئەو گەردونەی کە گەردون ناسەکان پێمان دەڵێن هەزار ملیۆن کاکێشان(مجرة)ی تێدایە.

هەموو ئەو شتانەی هەیە، هەر لە بچووکترین ئەلیکترۆنەوە تا گەورەترین ئەستێرە، وەکو ئاوازی گۆرانیەك دەمبینی، کە بەوپەڕی ڕێکوپێکییەوە دەهاتە گوێم، یان وەکو یەك لاشە دەهاتە پێش چاوم کە گیانی لەبەردا بێت.

زانست بەڕێگەیەکی مادییەوە، بە هۆی وەسیلەیەکەوە یارمەتی دەدام کە خودام بە بیردا بێ.

ئا لەم قۆناغەدا وام دەزانی خوا ئەو هێزە نادیارییەیە، کە لە بوونەوەردا هەڵدەسێ بە ڕێك خستنی ئەم شێوە جوانانە لە زیندەوەران و دار و بەرد و زەوی و ئاسمان، خوا ئەو جولانەوەیە، کە زانیاری لە گەردیلە و پرۆتۆپلازم و فەلەك دا دۆزیویەتەوە، خوا ئەو وزە دروستکەرەیە کە لە هەموو شتێکدا هەیە.

وەکو (قەدیس تۆماس)[1] دەڵێ: خوا ئەو کردەوە خالیصەیە، کە لە میکرۆبدا دەجولایەوە تاکو بوو بە مرۆڤ، ئێستەش دەگۆڕێ و دەگۆڕێ، بێدوایی هاتن هەر دەگۆڕێ.

بوونەوەر لەبەرچاوم وای لێهات کە بێسنورەو بێ دواییە، وام دەزانی ژیان

[1] تۆماس یەکێکە لە دوانزدە نێردراوەکەی پێغەمبەر (عیسا).

و جیهان هەروا دەمێنێ و، ئەو ڕۆژە نیە کە ئەم بوونەوەرەی تیا نەمێنێ.

کەوابو ڕاست نیە پرسیار بکەین کێ ئەو بونەوەرەی دروست کرد، چونکە پرسیار کردن ئەوەی بەدوادا دێ کە دەبێ ڕۆژێ بووبێ بوونەوەر دروست نەکرابێ، پاشان هێنراوەتە بوون.. چۆنیش شتێك نەبوبێ کیانی هەیە. نەبوون بۆ جیهان نیە و هیچ کاتێك نیە و نەبووە کە جیهان نەبووبێت، هەر بووەو هەر دەبێت..

بەم جۆرە وام زانی کە سەرەتا و دوایی بۆ جیهان نیە، وام دەزانی هەموو شتێك کە هەبوو ئەوە خوایە، نەبون نیە، خوا بونێکی ماددی‌یە هەر بووەو هەر دەبێ.

ئەمەم بۆ خۆم دروست کرد بۆ بوونی خوا، بەبێ پێویست بەوەی، کە بڕوام بە نەبینراو(غیب) هەبێت.

بەڵێ بەم جۆرە کەوتمە دیلیی بیرۆچکەی (وحدة الوجود)ی بیروباوەڕی هیندی‌یەکان و فەلسەفەی (سپینۆزا)[1] و بیرۆچکەی (برجسۆن) کە باسی وزەی ناوەکی دەکات، گشتیشی فەلسەفە گەلێکە کە لە زەویەوە دەست پێ دەکات... لە پێنج هەستەکان... دانیش بە نادیارەکان دا نانێت، بە قوڵتر چوومە ناو فەلسەفەی هیندی‌یەکانەوە، وام دەزانی هەموو دروستکراوێ دروستکەرە.

لە سیفری (یۆبانیشاد)-نوێژێکی کۆنی هیندی هەیە- ئەم مانایە لە هەندێك هەڵبەستی ناسك بەناوی (براهی)[2]ڕاڤە دەکات.

---

[1] سپینوزا: فەیلەسوفێکی هۆڵەندی‌یە، لەپێشا جوولەکە بوو وای دەزانی ژیان نابڕێتەوە.

[2] بـراهما: ئاییـنی زۆر کۆنـی هیندی‌یەکان بوو، بوزی‌یەکان هەڵسان بە تازەکردنەوەی ئەم ئاینە

ئەگەر بکوژ وای زانی کە بکوژە و
کوژراو خۆی بە کوژراو دانا
ئەوان نازانن شێوەی کردارم چۆنە..!
دەبم بە سنگ بۆ ئەو کەسەی دەمرێ
دەبم بە چەکیش بۆ ئەو کەسەی دەکوژێ
دەبم بە باڵ بۆ ئەوەی دەفڕێ
دەبم بە دوو دڵی بۆ ئەوانەی بڕوایان بە بوونم نیە
دەبم بە هەموو شتێك، تەنانەت خودی گومانیش
بەڵام من خۆم تەنیا و بێ وێنەم
من شتەکانم

ئەو خوایە، کە بە روناکیەکی سپی دەچێ.. یەکە.. ساکارە.. بەڵام لە ناوەوەیدا حەوت رەنگە شەبەنگەکەی لەخۆ گرتووە.

بەڵێ، چەند ساڵێك لەم تەم ومژەی باوەڕی هیندییەدا ژیام و لای زۆر لە مامۆستاکانی هیندی لە بناغە و پەلەکانی ئەم باوەڕەم خوێند. بیروڕای (گیان گواستنەوە= التناسخ) بە ماوەیەکی زۆر بەسەرم دا زاڵ بوو، لە چیرۆکەکانم ڕەنگی دایەوە، وەك (العنکبوت) و (الخروج من التابوت).

لە پاشا لە حاڵەتێکی رازی نەبوون و بڕوا پێ نەکردن بە ئاگاهاتم.

لە ئەنجامدا بۆم دەرکەوت ئەمیش زۆر شتی درۆی بەرامبەر بە خوا تیایە.

جارێکی تر هەر زانست بوو، کە ڕێی نیشان دام و رزگاری کردم و یارمەتی دام.

مانەوەم لەسەر زانست و لەسەر ئەوەی زیندەوەر بخەمە ژێر میکرۆسکۆب، شتێکی تری پێ وتم.

یەکێتی بوونەوەر(وحدة الوجود)ی هیندییەکان بریتی بوو لە هەڵبەستی سۆفیانە.. بەڵام ناڕاست.

ئەو حەقیقەتەی، کە زانست دوپاتی لەسەر کردووە ئەوەیە، کە دەڵێ کەرەسەی خاو هەموی یەکن لە چنین و یاسا و دەست پێکردنی سەرەتاییدا.. یەکن لە ژیاندا. چونکە هەموو ژیانی ئادەمیزاد و ڕووەك و گیانلەبەرەکانیتر بریتییە لە گۆڕینەوەی گازی کاربۆن لەگەڵ هێدرۆجین و ئۆکسجین و کردنیان بە خەڵوز... هەموو ژیانیش بریتییە لە یەك خانە و ماکەکانی.

بۆ جارێکیتر لە زانستی گەردون ناسی و کیمیا و زانستی ئەتۆمەوە فێر دەبین، کە هەموو ڕەگەزە جیاجیاکان(العناصر المختلفة) لە کولاندنی یەك ڕەگەز لەژێر تەنوری ئەستێرەکاندا پەیدا بون، کە ئەویش هایدرۆجینە..

هایدرۆجین دیسان هەر لەو تەنورەدا دەبێت بە هیلیۆم و کاربۆن سلیکۆن و کۆباڵت و نیکل و ئاسن و ...هتد. ئەمەش بە چەند شیتەڵ و بەستنێك بەهۆی پلەی گەرما و پاڵەپەستۆیەکی زۆرەوەیە.

کەوابور هەموو بوونەوەرەکان(الموجودات) دەگەڕێنەوە سەر یەك کەرەسەی خاو و گوریسی ئاوریشمی کە ئەم بوونەوەری بەم شێوە جوانە پێی ڕێسراوە بەم هەموو گوڵ و داڕشتنە جوانەوە بە چەند شێوەیەکی جیاجیا.

جیایی لەنێوان بابەت و بابەتێکی تر بەشێکی دروست کراو لەگەڵئەوی تردا، جیاییە لە پەیوەندی چۆنیەتی و چەندێتی... لە هاوکێشە و نهێنی پێکهاتەیدا، بەڵام کەرەسەکەیان یەکێکە، لەبەر ئەمەیە هەست دەکرێ بە نزیکی و خزمایەتی و دڵسوتان لەنێوان ئادەمیزاد و گیانلەبەرەکانی تردا، لە نێوان لوت و بۆنی خۆشی گوڵ و، چاو و دیمەنێکی جواندا.

ئا ئەمە نهێنی هارمۆنی و گونجاندنە. هەموو بونەوەرێك ئەندامی یەك

خێزانی دایك و باوکێکە.

کەوابو ئەمە درۆیە پارچەکانی بوونەوەر خۆیان دروستکەری یەکتر بن. یان خوا بونەوەرە، یان دروستکراو دروستکەرە، ئەمە شتێکی تێکەڵ و پێکەڵی سۆفیانەی ناڕاستە.

ئەمە وەکو ئەوە وایە ڕەخنەگرێك بڕواتە پێشانگایەکی وێنە، کە ژمارەیەکی زۆر تابلۆ و وێنەی تێدا هەبێ، لەو هەموو وێنانەدا وێنەیەکی جوانی بەدی کرد و بۆی دەرکەوت ئەم هەموو وێنانە لەسەر شێوازی ئەم تاکە وێنەیە دروست کراوە.

یەکسەر دەڵێ ئەم وێنانە هەموویان یەك هونەرمەند دروستی کردون، ئەم وێنانە یان (بیکاسۆ) یان (شاکاڵ) یان (مۆدیلیانی) بە پەڕی ڕەنگین کێشاویانە..

کەواتە یەکێتی لە نێوان دروست کراوەکان مانای بونی یەك بەدیهێنەری دەگەیەنێ.

بەڵام مانای ئەوە نیە خودی دروستکراوەکان دروستکەرن.

ڕەخنە گرەکەش هەرگیز ناڵێت ئەم وێنانە خودی وێنەکێشەکەیە .

یەکێتی بونەوەری هیندییەکان تەڵەکە و دەست بڕینە... ئەمە ساویلکەیی ویژدانە، نە زانست و نە عەقڵ دان بەمەدا نانێت.

بەڵکو هەمو بیردۆزە زانستییەکان بۆیان دەرکەوتووە، کە یەکێتییەکی تەواو هەیە لەنێوان هەموو دروستکراوەکانی جیهاندا.. یەکێتی شێواز.. یەکێتی یاسا.. یەکێتی کەرەسە.. ئەمانە هەموو ئەوە دەگەیەنێ کە دروستکەرەکەیان یەکە و یەك کەس هەموویانی دروست کردووە و هەر تەنیا بەشێوازە نازدارەکەی خۆی و بەبێ ڕازیبوون بە شێوازی یەکێکی تر.

دیسان زانست پێمان دەڵێ، ئەم دروستکەرە خاوەنی ژیرییەکی گشتی و دەسەلاتێکی وەهایە ڕێگەی چۆنیەتی گەورەبوون و چۆنیەتی ژیانی بۆ هەموو دروست کراوەکانی داناوەو چەکداری کردوون بەرامبەر دوژمنەکانیان بۆ مانەوەیان.

ئەو دروستکەرە ئەوەیە کە باڵ دەدا بە تۆوی داری بیابانەکان تاکو بفڕێت و بگات بە شوێنی ئاودار بۆ ڕواندنی.

ئەو دروستکەرە ئەوەیە کە، بەبێ پێوتنی مامۆستا (ئەرخەمێدس)[1]، توورەکەی هەوایی بۆ گەرای مێشولە دەکات، تاکو لە ئاودا نوقم نەبێت و نەخنکێت.

بەڵێ بۆم دەرکەوت کە ئەوە دروستکەری ئەم هەموو دروستکراوانەیە.. باڵادەستە.. ئەوەی ئەو دەیزانێ ئێمە نایزانین..

بە وانایە و شتی وا دەبینی کە کەسی تر ناتوانێ بیبینێ.

خودا تاکە..بە توانایە.. زانایە، لێزانە، بیسەرە، بینایە، ئاگادارە، هەموو سیفەتێك دەدات، بەدەسەلاتە.. دەبیستێ..

پەیوەندی ئەم دروستکەرە لەگەڵ دروستکراوەکانی نزیك ترە لە هاتوچۆی خوێن بەناو لەشدا.[2]

هەر ئەو دەتوانێ، کە ئەم جیهانە، بەم وردی و دوور لە هەموو هەڵەیەك، برازێنێتەوە.

هەر ئەو خوایە دادگەرەیە کە یاساکانی خۆی پتەو کرودوە و لەسەر چەند

---

[1] ئەرخەمێدس: زانایاکی یۆنانییە و خاوەنی چەند بیردۆزەیەکی زانستییە، بە تایبەتی نظرية الطفوء.

[2] (ونحن أقرب اليه من حبل الوريد)

ڕێسایەکی ورد دایمەزراندوە کە هەڵە ناکات، ئا بەم شێوەیە زانست فیکرەی تەواوی ئیسلامی دەربارەی خودای پێشکەش کردم.

* * *

ئەوەی کە دەڵی ئەم جیهانە هەر بووەو هەر دەبێ، نەبوونی نەبووە. بێجگە لە یاریکردن بە وتە هیچی تری تێدا نیە.

لە واقیعیشیدا نەبوو، نەبوو نیە.

نەبووش لە تێڕوانین و فیکردا نەرێی ئەوە دەکات کە نەبێ.

بە زۆریش نەبوو نەرێی ئەو شتەیە دەیزانین، بەڵام نەرێیەکی رەها نا، کە بە تەواوی بیسڕێتەوە، بیرۆچکەی نەبوونی ڕەها (العدم المطلق) گریمانەیەکی وەك گریمانەی سفری بیرکاری.. ناشکرێ و دروست نیە گریمانە و واقیع تێکەڵ بکەین، دروستیش نیە واقیع بکەینە گریمانەیەکی تیۆری و بە کوێرانە بڵێین نەبوون نەبووە و، وا دابنێین، ئەم قسەیە مەسەلەیەکی وجودیە، کە لە واقیع دا چەند یاسایەکی لەسەر بنیات بنێین.. ئەمەش هاودژیەکی راشکاوانەیە و قسەیەکی بێ هودە و بێ خێرە..

بە هەمان نمونەش بڵێین بونەوەر بووە.. ئالێرە هەمان تێکەڵی دەبینین.. چونکە بونەوەر شتێکی روتی زیهنییە، مەوجودیش واقیعێکی هەستیاریە..

جا وشەی نەبون و وشەی هەبوون دوو شتی ڕووتی زیهنین وەك سفر، دروستیش نیە تێکەڵی بخەینە بێ کۆتایی (اللانهایة) و واقیعی بەرهەست، هەروا بونەوەر، کە هەیە و دیاریکراوە ناکرێ لەبەردەم هەستەکان دا بنرێ.

کەواتە بونەوەر تا سەر نامێنێ و نەبونی دەبێت وەکو نەبونی بووە بەپێی دوا فەرهەنگی زانست-یاسای دووەمی- دینامیکای گەرمی-، ئەم یاسایە دەڵێ:-

(گەرما لە تەنێکی گەرمەوە دەڕوات بۆ تەنێکی سارد، تاکو لە گەرمیدا وەکو یەکیان لێدێت، ئیتر لە پلەیەکی گەرمایی یەکساندا ڕادەوەستن تاکو دەست دەکەن بە ساردبونەوە).

ئەگەر ئەم بوونەوەرە هەر ببوایە بەبێ سەرەتا ئێستا هەموو هێزێکی گەرما بەکاردەهێنرا و ژیان نەدەما تاکو ئەمڕۆ، دیسان مردنی ئادەمیزاد و مردنی شارستانیەتی و مردنی ئەستێرەکان و هەموو گیان لەبەرانیتر.

خودی ئەم یاسایەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە ئەم بونەوەرە سەرەتای هەبووە.

ئەو قیامەتە گچکەی کە لە دەوروبەرماندا دەیبینین، هەر لە مردنی ژیارەکان و مردنی خەڵك و مردنی ئەستێرەکان و مردنی گیانلەبەر و ڕوەکەکان و کۆتایی هاتنی ساتە وەختەکان و ساڵەکان، دیمەنێکی تری قیامەتی گەورەیە، کە پێمان دەڵێ هەردەبێ ئەم بوونەوەرە کۆتایی پێ بێت.

بەڕاستی زانست هەرگیز دژی ئایین نیە و بەربەرەکانێ ناکات لەگەڵ ئایین دا، بەڵکو ئادەمیزاد هەر بە زانست دەتوانێ مانای ئایین بزانێ.

بەڕاستی هەر نیوەی زانستە گومان و دودڵی دەخاتە ناو عەقڵەوە.. بەتایبەتی گەر ئەم عەقڵە بەخۆی بنازێ و لوت بەرزبێ و پشت بە عەقلانیەتی خۆی ببەستێ.. بەتایبەتیش گەر لە سەردەمێکدا جەنگێك لە ئارادابێ، کە وا بزانرێ عەقڵ تێیدا هەمو شتێکە.. هەروا گەر مرۆڤ تەنها ژیاری مادیی ببینێت، کە فڕۆکە و کەشتی ئاسمانی و مانگە دەسکردەکانی تێدا بنەڕێنێت و.. هەر ساتێك هاوار بکات:

من ماددەم.. من هەمو شتێکم.

هەمومان یەك ڕەگەزین.

لەیەك کەرەسەی خاودا.

هەر یەکەمان خاوەنی تاکێکی سەربەخۆین.

جیاوازی لەنێوان دروست کراوەکاندا تەنیا جیاوازی کەم و زۆری گەردیلە(ذرة)کانی نیە و بەس..! بەڵکو جیاوازی‌یەکی گەورەتر هەیە، کە ئەویش چۆنیەتی لکاندنی ئەو گەردیلانەن پێکەوە و جۆری پەیوەندیان.

ئێستە لە هەڵپێچانی تۆوەکانی بۆماوەیی (الجینات الوراثیة) لە یەکەم خانەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە هەمو کۆرپەی مرۆڤ زیاتر لە (٢٠) پیتی کیمیاوی لە پرۆتین (DNA) و (RNA) تێکەڵی دەبێ وەکو چۆن هەموو پەڕاو و پەرتووکەکان لە پیتەکانی ئەلف و بی پێك دێت، کەچی هەر پەرتووکێك جۆرە شێواز و مەبەستێکی تایبەتی هەیە و دەڵێی دروستکراوێکی جیاوازە لە پەرتووکەکانی‌تر. لەگەڵ ئەوەشدا هەموویان یەك جۆرە پیتن.

لەمەش رونتر، دەبینی، کە هێڵی پەنجەکانی دوو کەس لە یەك ناچن با برابن یان بە جووتەش لەدایك بووبن. سەرەڕای ئەم هەموو هەزاران ملیۆن خەڵکەش هەر لە ڕۆژی دروست بوونی ئادەمیزادەوە تاکو ئێستە.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە هەر لەشێك جۆرە داڕشتێنکی کیمیائی‌تایبەتی خۆی هەیە و نابێت کە پارچەی لەشێك بۆ پینە بەکار بهێنری بۆ لەشێکی تر.. هەروا جەستەش ئەو پارچە نامۆیەی قبوڵ نیە، جا ئەو شتە

میکرۆب بێ یان تەنیکی بێگانە بێ.

ئەمەش گەورەترین کۆسپە لەڕێی پزیشکە نوژدار(جراح)ەکاندا و ناتوانن بە ئاسانی پارچەی لەشێك بنێن بە لەشێکی ترەوە.

درێژترین ماوەی ژیانی دڵێك کە لە جێی دڵێکی تر دانرابوو (٢٠) مانگ بوو. ئەویش بە ڕهێڵە دەرزی و بەنج و حەبی دژی (حساسیە)یان بەسەریا دەباران، بۆ مانەوەی ئەم دڵە تازە لەو لاشەدا.

مانای ئەوەش ئەوەیە، کە تاکیەتی و بەتاك کردنی ڕاستیەکی کرۆك(جوهر)یە، کە زانست گەواهی بۆ دەدات..

ئەمەش ڕاستەیەکە کە، لە سەرەتای پێشکەوتنی فیکرم ئاوڕم لێ نەدابووەوە، وام دەزانی ئەوەی کاکڵەیە و دەمێنێ، کۆمەڵە نەك تاك.. مرۆڤە نەك فلان.. ژیانە نەك ژیاو.. هەمووە نەك یەك.

ئەمەش شوێنەوارێکی فەلسەفەی هیندیەکانە، کە دەڵێ:

بوون خوایە و دەمێنێ هەتا سەر، بەڵام هەموو ئەو شتانەی هەن بریتییە لە المایا (maya) کە ئەویش خەیاڵێکە نامێنێ، هەر کە مرد دەڕزێ و ئیتر زیندوو نابێتەوە، پاش مردن پاشەکەوتی هەر ئەوەیە پەروەردە و زانست و سامانی بۆ منداڵەکانی بەجێ دەهێڵێ.

بەڵام خۆی هەر ئەوەیە دەدرێت بەدەم هەواوە باڵ دەگرێتەوەو بەشی هەتاهەتاییمان ئەوەیە، کە دەچینە ناو دەفری هەموانەوە.

ئیتر نرخ و شەخسیەتی ئەم ئادەمیزادە کامەیە...؟

من هیچ لە شەخسیەت نەگەیشتبووم جگە لەوەی، کە بریتی بێت لە چەند کاردانەوەیکی بارودۆخی بەسەر چەند هەڵوێستێکی کاتیدا، جا هەرکە ڕەوشەکە کۆتایی پیهات و کاتەکە گۆڕانی بەسەرداهات، هیچ لەو شەخسیەتە نامێنێت... لە ئەنجامدا بە پیربوون و هەڵوەشاندنەوەی ڕیشاڵەکانی مۆخ

ئەمیش نامێنێت.

کاتێکیش دەمارەکان تێك دەچن و بە مردن لە ناو دەچن و، هەمان خودی تایبەتی لە ناو دەچێ.

وام دەزانی کەسایەتی تەنها دابڕانێکی دیاریکراوی چەند سیفەتێکی دیاریکراوە، بە کاریگەری چەند ئەزمونێکی زیندوو و چەند کردەوەیەکی پێچەوانەی دەمارگیریە..

کە هەندێکی لە شێوەی غەریزە دا بۆمان ماوەتەوە، هەندێکی تریش لە رێگەی مومارەسەی هەستی وەرگیراوە.. ئەم مومارەسەیەش لە مێشك تۆمار دەکرێ و لە بیرەوەریدا چاپ دەبێ. جا گەر مێشکەکە کۆتایی هات و خانەکانی بیرەوەریی گەندەڵ بوو، ئەو کاتە پێویست بە مانەوە رۆحانیەکەی تری ئەم پەیوەستە مادییە پوختە ناکات.

لە سەرەتا دا بەم چەمکە مادییە روکەشەوە دەمرۆانیە ئادەمیزاد، بە خۆشم دەگوت شەخصیەت یەك شت نیە لە هیچ کەسدا..! هەر کەسە چەند شەخصیەتێکی هەیە.. شەخسیەتی تەمەنی (١٥) ساڵی جیایە لەگەڵ شەخسیەتی تەمەنی (٢٠) ساڵی، (٢٠) ساڵی لەگەڵ (٣٠) ساڵی.هتد... هەموو تاوێك لەو کەسە شتێك کەم و شتێك زیاد دەکات...

ئیتر کام شەخسیەت لەمانە زیندوو دەکەنەوە بۆ لێپرسینەوەو سزادانی یان پاداشت دانەوەی؟ ئەوانەی، کە توشی دابەش بونی کەسایەتی بون، کامەیان دەچێتە جیهانەکەی تر، دکتۆر (جیکل) یان مستەر (هاید)؟

بەڵێ بەم جۆرە شەڕە وتەی پووچ دەکەن.. نازانن ئەگەر ئێمە بمانەوێت پەرتوکێك بۆ جاری دووەم لە چاپ بدەینەوە، یەك پەڕە یان یەك باس لەو پەرتوکە چاپ ناکەین.. بەڵکو هەموو پەرتوکەکە بە هەموو لاپەڕە و باسەکانیەوە لە چاپ دەدەینەوە.

هەر بەم جۆرەیە، مرۆـڤ بە هەموو بەشەکانیەوە زیندوو دەبێتەوە. وەکو دەنکێك گەنم کە فڕێ دەدرێتە ژێر تاریکی زەوییەوە، کاتێ سەوز دەبێت و دەڕوێت، هیچ شتێك لە شێوەی گەنمەکەی لەبیر ناچێتەوە.. چۆن بووە هەر بەو جۆرە دەڕوێتەوە..!

بەڵام دیدگای مادیی کە بە سروشتی خۆی بەلای شیکردنەوە و توێکاری و لەت لەت کردنە، بە درێژایی کاتیش هەر ئەمە زاڵ بووە، جا لەبەر ئەمە هەردەم وێنەی تەواوی شتەکانم لەبەر چاو نادیار بووە.

وام دەزانی، کە ئەگەر لاشە یەکالاّ(تشريح) بکەم گیانم دەست دەکەوێت، چونکە لام وابوو گیان(روح) هەر لاشەیە و هیچ جیاوازییەك نیە لەنێوان گیان و لاشەدا.

گیان لاشەیە..

عەقڵ مێشکە..

شەخسیەت چەند کاردانەوە و چەند کردەوەیەکی پێچەوانەی ئارەزووە..

سۆزیش لە کۆتاییدا برسیەتی لاشەیە بۆ ئەو شتە..

بەڵام لێرەدا ئێمە هەڵوەستەکی درێژ دەکەین و پرسیار دەکەین:-

ئایا ڕاستە نەفس پاڵنەری برسێتی و جنس و کۆمەڵە هەستپێکردێکە کە جەستە پەی بە پێویستیەتی دەکات؟.

گەر ئاوامان گوت، ئەوا ئێمە لەبەردەم تەفسیرێکی مادیی کوێرانە داین، ئەمەش نە حەقیقەتی نەفسە و نە حەقیقەتی مرۆڤە.. دەشگەڕێمەوە لاپەڕەکانی کتێبی (لغز الموت) و (لغز الحياة) کە بەدرێژی تاوتوێی بابەتەکەم کردوە.

مرۆـڤ قوربانی بە پارووە نانەکەی و جێگە گەرمەکەی دەدات لە پێناو چەند ئامانج و نمونەی بەرز و ڕوتی وەك دادگەریی و حەقخوازی و خێرخوازی و سەربەستی.. کەواتە کوا پاڵنەری برسێتی و ئارەزوی جنسێتی؟.. ئەوەی خۆی

ده‌دا به‌ کوشت بۆ هاتنی ڕۆژێك كه‌ هێشتا نه‌هاتووه‌..! ئیتر ئه‌و له‌ ته‌فسیری مادیی له‌ كوێیه‌؟

ئێمه‌ له‌به‌ر ده‌م سه‌لماندنێكی بڕه‌ر داین، كه‌وا نه‌فس و خود (ذات) حه‌قیقه‌تێكی له‌ سنور به‌ده‌ر و به‌رزه‌ به‌سه‌ر لاشه‌دا، ته‌نیا پێداویستی هه‌ستی جه‌سته‌ نیه‌ كه‌ له‌ ئاوێنه‌ی ناوه‌وه‌ ڕه‌نگی دابێته‌وه‌.

ئه‌و هێزه‌ی، كه‌ لاشه‌كه‌ی خۆی پێ‌شێل ده‌كات و ده‌یدات به‌ قوربانی، ئه‌وه‌ سه‌رۆك و-فه‌رمانده‌یه‌- به‌سه‌ر لاشه‌دا.. و كلكی نیه‌..

چونكه‌ ئه‌گه‌ر من به‌س لاشه‌ بم چۆن ده‌توانم زۆر له‌ لاشه‌م بكه‌م و بیده‌م به‌سه‌ر هه‌زاران به‌ردی سارد و گه‌رمدا..

یا من ئه‌گه‌ر برسیه‌تی بم چۆن ده‌توانم كه‌ برسیم بوو، خۆم بگرم.

جا به‌ ته‌نها ده‌سه‌ڵاتی ناوه‌كی به‌سه‌ر گشت توخمه‌كانی جه‌سته‌ و موفره‌داتی غه‌ریزه‌كان، شایه‌تی ئاشكراكه‌ری ئه‌م توخمه‌ به‌رزه‌ و ئه‌و جیاوازیانه‌یه‌ كه‌ خودی مرۆڤایه‌تی لێ پێكدێ.

له‌ڕێگای نه‌فسه‌وه‌ لاشه‌م هه‌ڵده‌سوڕێنم
له‌ڕێگای عه‌قڵه‌وه‌ نه‌فس هه‌ڵده‌سوڕێنم
له‌ڕێگای به‌رچاوڕۆنی‌یه‌وه‌ سنورێك بۆ هۆش داده‌نێم.

ئه‌و به‌شانه‌ی له‌ لاشه‌ماندا هه‌ن هه‌ریه‌كه‌یان فرمان ده‌دات به‌سه‌ر ئه‌وه‌ی له‌خۆی خوارتردا، لێره‌دا فه‌رمانده‌یه‌ك له‌ هه‌موویان به‌ ده‌سه‌ڵاتره‌، فه‌رمانده‌ی هه‌موو تێشووه‌كانی له‌شه‌.. كه‌ ئه‌ویش، گیانه‌... گیانیش كلك و پاشكۆی نیه‌، كه‌ به‌ مردنی بمرێ.

ئه‌و مادده‌یانه‌ی، ده‌ڵێن ئاده‌میزاد بریتی‌یه‌ له‌ كۆمه‌ڵه‌ پێویستیه‌كی فسیۆلۆجی مادی و به‌س...! ئه‌وه‌مان بۆ ڕاڤه‌ بكه‌ن، له‌ كاتی نوستن دا ئه‌م مرۆڤه‌ ده‌چێته‌ كوێ؟.

سەیر دەکەیت هەمو کردەوە فسیۆلۆجی‌یەکانی لەش بەردەوامن لە ئیش کردن لەکاتی نوستندا گشت کردەوەکانی خۆنەویستی (لا إرادي) بە ڕێك و پێکی کاردەکەن.. دڵی لێدەدات.. سی‌یەکان هەوا ئاڵ و گۆڕ دەکەن.. ئارەزوی پیاوەتی(الجنس) هێرش دەهێنێ.. ئەگەر درکێك بچێت بە دەستدا دەستی هەڵدەکێشێت... لەگەڵ ئەمەشدا ئەم نوستووە لەبەر دەستماندا کەوتووە، دەڵێی دارێکی ڕەقە.. هەر دارێکی ڕەقە... یان ژیانێکی سەرەتایی‌یە، کە لە ژیانی زیندەوەر جیاوازی نیە، ئیتر کوا ئادەمیزاد...؟

خەوتن و لەخەو هەڵسان نمونەیەکی بچوك کراوەیە بۆ زیندوبونەوەی پاش مردن. ئەو نوستووە بێدەسەڵاتە سەیر دەکەیت یەکسەر هەڵدەسێ و بەبێ خۆ ئامادەکردنەکەی (هیتلەر) و (نیرون) ئەو کردەوانەی لەپێش نوستندا دەیکردن ئێستاش دەیانکات و هەرچی پێش نوستن کردویەتی دێتەوە یادی.

لێرەدا ماددی‌یەکان لەبەردەم ڕاستی‌دا سەرشۆڕ دەکەن و ناتوانن بڵێن (نفس) نیە، دەڵێن (نفس) هەیە و ڕاستە، چونکە لە ئەنجامدا بە ماددە دادەنرێت.

ئێمەش دەڵێین (نفس) چۆن دەبێتە بابەت..؟ دەبێتە بابەتی کێش...؟ هەتا ئەگەر ئەو کەسەیش پارچەپارچە بکرێت و بخرێتە ژێر میکرۆسکۆبەوە نابینرێت، ئیتر ماددەی چی‌یە..؟

سەبارەت بە کەسانی تر بابەتە؟! چۆن وایە؟! ئەوانی دیش هەست بە بونی ناکەن مەگەر لە ڕوکەشی ڕەفتارەوە هەڵیهێنجن..

ئەو ڕووکەشانەش زۆر نیە، یان درۆ نیە.. هەر یەکێك لە ئێمەش نمایندەی خەڵکە بەڵکە نمایندەی خودی خۆی و ڕەفتاری روکەشیەتی. کەم جار هەیە ببێتە بەڵگە لەسەری.

یان بابەتە سەبارەت بە خاوەنەکەی؟

کەوابو دەبێ ئێمە بڕوامان بە شتێك هەبێت، کە نابینرێت. ئێمە هەست کەر و هەست پێ‌کراومان هەیە.

مەرجی هەست کەر ئەوەیە لە دەرەوەی هەست پێ‌کراوەوە بێت، کەوابو ئەو هەست کەرەی ئێمە هەمانە لە دەرەوەی لەشمانە.

چونکە ئەگەر لەناو لەشدا بوایە هەستمان بەس بە شتەکانی ناو لەشمان دەکرد و ئاگاداری دەرەوەی نەدەبوین و بیرەوەریمان لەگەڵ چرکە ژمێردا دەڕۆیشت و..بێ‌ئاگا دەبوین لەپێش ئەو کاتە..

ئەمەش یاسایە دەڵێ: هەست بە هیچ شتێك ناکەیت، ئەگەر لە دەرەوەی ئەو شتەوە نەبێت.

تۆ هەست ناکەیت بە سوڕانی زەوی چونکە خۆتی لەسەری، بۆ زانینی چۆنێتی سوڕانی گۆی زەوی دەبێ لە دەرەوەی سنوری زەوی‌یەوە بوەستیت.

خۆ ئەگەر لەسەر زەوی بیت تۆش پارچەیەکی زۆر بچوك و نادیاری زەویت.

هەروەها بۆ زانینی جوڵان یا زانینی چۆنیەتی هەمو شتێك دەبێ لە دەرەوەی ئەو شتەوە بیت.

کەوابو چونکە هەست بە ڕۆیشتنی ڕۆژگار دەکەیت تۆ لە دەرەوەی ئەو ڕۆژگارەیت.

بەمەدا بۆمان دەردەکەوێت، بونی گیان(روح) جیاوازە لە بوونی ئێمە و پلەی بەرزترە لە بون و لاشە و ڕۆژگاری ئێمە...!

ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە ئێمە دەبین بە دوو بەشی سەرەکی‌یەوە، بەشێکمان چەقیوەتە ناو ڕۆژگار و دەڕوات لەگەڵیا، گەورە دەبێت.. پیر دەبێت.. لەهێز دەکەوێت.. هەتا دەمرێت.. ئەمە لاشەیە.

بەشەکەی ترمان لە دەرەوەی ڕۆژگارە، کە گەورە نابێت.. پیر نابێت.. ناسوێت.. کاتێ لەش دەبێت بە گڵ و مێرو دەیخوات، ئەو هەروەکو خۆی

دەمێنێتەوە. ئەم بەشە ئەوەیە، کە ئاینەکان پێی دەڵێن گیان (روح).

هەرکام لە ئێمە دەتوانێ لەناخی خۆیدا هەست بە بونی ئەم گیانە بکات، هەروا بۆی دەردەکەوێت، کە چۆنێتی ژیانی گیان جیاوازە لەگەڵ جۆری ژیانی لاشە.

هەر یەکێك لە ئێمە هەردەم دەتوانێ لە ناخیدا هەست بە حاڵەتێکی ئامادەیی و گوێ رایەڵی و کەسایەتی و هەست بە بونێکی حازر و تەواو و جیا لەو وجودە مادیە گۆڕاوەی، کە لە دەرەوەی زەمەن لێدەدات و دەلەرێتەوە.

ئەم حاڵەتە ناوەکی‌یەی، کە لە ساتەکانی بە ئاگابونی ناوەکیەوە هەستی پێ دەکەین، کە ناوم لێناوە حاڵەتی (ئامادەبون).. ئەوە ئەو کلیلەیە، کە لە ناخمدا بەرەو بوونی گیانمان دەبات، دەستیشمان دەخاتە سەر ئەو شتە نادیارەی، کە ناوی گیانە.. یان رەهایە.. یان (مجرد)ە.

ئێمە هەرکاتێك شتێکی جوان دەبینین جیای دەکەینەوە لە شتی ناشیرین، یان ڕاستی دەبینین جیای دەکەینەوە لە درۆ، یا دادپەروەری دەبینین جیای دەکەینەوە لە ستەم.

بۆ زانینی ئەمانە گەز و ترازومان هەیە، کە جوان لە ناشیرین و ڕاستی لە درۆ..هتد..ی پێ جیا بکەینەوە. ئەم ترازووەش گیانە.

بۆ نمونە.. ئێمە دەزانین دەبێ هەمومان بمرین و کەسمان تا سەر ناژین، کەچی هیچ کاتێك خۆمان بۆ مردن دانانێین وەکو هەر نەمرین، یان مردن ناوی هەیە و ناوەڕۆکی نیە.. بەس بایە و بەلای گوێماندا دەڕوات. بەڵام ئەوەی کە ئەم نوزەمان دەدات بە گوێدا، گیانە. ئەو گیانەی کە خۆی نازانێ مردن چیە.

مردن بۆ گیانی ئەو بریتی‌یە لە داڕنینی کراسێك لە بەریا-بێ زیاد و کەم-ئەو مردنەی، کە بریتی بێت لە نەمان و ڕزین بۆ گیان نیە هەردەم هەیە.

وەکو زانایانی تصوف دەڵێن: گیان بەرگی لەخۆڵ دادەڕنێ و بەرگی بەرزەخی

لەبەر دەکات، پاشان بەرگی بەرزەخی دادەڕنێ و بەرگی مەلەکوتی لەبەر دەکات، دیسان ئەویش دادەڕنێ و بەرگی جەبەروتی لەبەر دەکات، بە خۆکوشتن و هەوڵ دان پلە بە پلە سەر دەکەوێ بۆ لای خۆشەویستەکەی، کە بەدیهێنەرەکەیەتی، هەمو گیانێك بە ئەندازەی پاکی و رۆشنی و توانستی خۆی بەرز دەفرێ.

سۆفیگەریەکان بۆ دیدی خۆیان بەجێ دێڵم تا لەگەڵ ئەواندا ون نەبین و چەواشە نەبین، ئامانجیشم لەم توێژینەوەیەدا بڕینی بەربەستی مردن نیە تا بزانین دوای مردن چیە، چونکە ئەمە ئارەزویەکی مەحاڵە بزانین.

ئەوەندەم بەسە هەڵوەستە بە خوێنەر بکەم تا لە خۆی رابمێنێ و خودی قوڵ و بە دەسەلات و فەرماندەی بەرزی جەستە خۆڵیەکەی ئاشکرا بکات.. کەناوم لێناوە گیان (روح).. کە ئەو پەڕی بەڵگەم لەسەری هێناوەتەوە... بە هەستی بون و ئامادەیەوە کە هەر یەکێك لە ئێمە لە ناخیەوە هەستی پێ دەکات.

ئەو بون و ئامادەییە بەردەوامەی، کە نەمانی بەسەردانایەنی و گۆڕانکاری بەسەردانایێت، وەك بڵێی هەردەم لە ناخمدا چاوی کراوەیە.

ئەوەش رابون و بە ئاگایی ناوەخۆیە.

گیان ئەو روناکیە نابینراوەیە لە ناخماندا، کە بە هۆیەوە رێگای حەقی پێ دەبینین و ئاشنای جوان و ناشیرین و چاکە و خراپە دەبین.

گیان ئەو روانگەیە، کە لە سەریەوە چاوەدێری جوڵەی کات دەکەین و بە رۆیشتنی دەزانین.. هەروا رۆیشتنی شتەکان دەبینین و هەست بە جوڵەی دەکەین.

گیان ئەو خاڵەیە، کە لەناو بازنەیەکدایە.

گیان ئەو چەقەیە، کە ڕووداوە دنیایی و کاتیەکان بە دەوریدا دەسوڕێنەوە، کە لە شوێنێك چەقێنراوە و نابزوێ و هەر شتێك، کە هەیە بەبێ ئەو ناڕوات و

